# چل گوڵ لە گوڵزاری فەرموودەی

# پێغەمبەری خۆشەویست

صلی الله علیه وسلم



## چل گوڵ لە گوڵزاری فەرموودەی پێغەمبەر ی خۆشەویست صلی الله علیه وسلم

1- خَيرُكُم مَن تَعَلَّمَ القُرآنَ وَعَلَّمهُ . ( رواه البخاري و الترمذي و أبو داود)

**باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر دەبێ و کەسانی تریش فێر دەکات .**

2- إتَّقِ الله حَيثُما كُنتَ وَأَتبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمحُها وَ خَالِقِ النّاسَ بِخُلُقٍ حَسَن . ( رواه أحمد والنسائي والحاكم والبيهقي )

**لە هەر کات و حاڵەتدا بووی لە خوا بترسە و پارێزگاربە، بە شوێن هەڵە و تاواندا چاکە بکە ، تا بیسڕێتەوە.. لەگەڵ**

**خەڵکی دا بە ڕەوشتی جوان هەڵس و کەوت بکە .**

3- وَالَّذي نَفْسي بِيَدِهِ لاَ يُؤمِنُ أحَدُكُمْ حَتَّى أكُونَ أحَبَّ إلَيْهِ مِنْ نَفْسِهِ وَاهْلِهِ وَمَالِهِ والنَّاسِ أجْمَعِينْ . ( رواه البخاري )

**سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە؛ هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی نییە تاکو من لە خۆی و کەس و کاری و هەموو خەڵکی خۆشەویست تر نەبم لە لای .**

4- المُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ المُسْلِمونَ مِنْ لِسانِهِ وَيَدِهِ . ( رواه مسلم و أبو داود)

**موسڵمان ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمانی و دەستی بێوەی بن .**

5- دَعْوَةُ المرءِ المُسْلِمِ لِأخِيهِ بِظَهْرِ الغَيْبِ مُسْتَجابَةٌ .( رواه مسلم و أبو داود)

**دۆعای مرۆڤی موسڵمان بۆ برای موسڵمان ، لە پاشملە ، لای خوای قبووڵە .**

6- لَيسَ المُؤمِنُ بالطَّعّانِ ولاَ اللّعانِ وَلاَ الفاحِشِ وَلا البَذيء .( رواه البخاري و الترمذي )

**بڕوادار تانە و تەشەر لێدەرو لەعنەت و نەفرینکەرو جوێن دەرو دمم پیس نی یە .**

7- مَنْ كَانَ يُؤمِنُ باللهِ واليَوْمِ الآخرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ ، وَ مَن كانَ يُؤمِنُ باللهِ واليَوْمِ الآخرِ فَلْيَصِلْ رِحمَه... وَمَنْ كَانَ يُؤمِنُ باللهِ واليَوْمِ الآخرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أو لِيَصْمُتَ . ( متفق عليه )

**هەر کەس بڕوای بە خواو پاشە ڕۆژ هەیە با ڕێزی میوانی بگرێت... هەر کەس بڕوای بە خواو پاشە ڕۆژ هەیە با سیلەی ڕەحم بە جێ بێنێت و ئاموشۆی خزم و نزیکانی بکات... هەر کەس بڕوای بە خواو پاشە ڕۆژ هەیە با قسەی چاک بکات یا بێ دەنگ بێت .**

8- لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَاتٌ . ( متفق عليه )

**ئەو کەسەی کە گوێ بۆ قسەی خەڵکی هەڵدەخا و قسە چنی دەکات ناچێتە بە هەشتەوە .**

9- لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرحَم صَغيرَنا وَيُوَقِّرَ كَبيرَنا . ( رواه أبو داود بسند صحيح )

**لە ئێمە نی یە کەسێک بۆ بچوکمان سۆز نەنوێنێ و ڕێزی گەورەمان نەگرێ .**

10- لا تَباغَضُوا ، وَلا تَقَاطَعُوا ، وَلا تَحاسَدُوا ، وَلا تَدابَرُوا ، وَكُونُوا عِبادَ اللهِ إخوَانا . ( متفق عليه )

**یەکتری مەبوغزێنن و (ڕقتان لە یەکتری نەبێت) پەیوەندیتان پێکەوە مەبچڕێنن. بە یەکتری حەسوودی مەبەن. پشت لە یەکتری هەڵمەکەن و (ئاگاتان لە یەکتری بێت) ، هەمووتان بەندەی خوا و برای یەکتری بن..**

11- آيةُ المُنافِقِ ثَلاثٌ ، إذا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإذا وَعَدَ أخلَفَ ، وَإذا اؤْتُمِنَ خَانَ . ( متفق عليه )

**نیشانەی ( دوو ڕوو ) سێ شتە : کاتێ قسەی کرد درۆ بکات . کاتێ بەڵێنی دا نەیباتە سەر . کاتێ سپاردەی لا دانرا خیانەتی تیا بکات .**

12- لا يَستُرُ عَبدٌ عَبْداً في الدُّنيا إلاّ سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ القِيَامَة .( رواه مسلم )

هەر کەسێک عەیب و ناتەواوی کەسێک لە دنیادا دابپۆشێت ؛ خوا لە پاشە ڕۆژدا عەیب و ناتەواوی ئەو کەسە دادەپۆشێت .

13- سأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ الله (صلى الله علية وسلم) : أيُّ الإسلام خَيرٌ ؟ قَالَ : تُطْعِمُ الطّعامَ وتَقرأُ السَّلام عَلى مَن عَرَفتَ وَمَن عَرَفتَ وَمَن لَم تَعرِف . ( متفق عليه )

پیاوێک لە پێغەمبەری خوای (صلى الله علية وسلم) پرسی : چ جۆرە کردەوەیەکی موسڵمانانە چاکترە؟ فەرمووی : خۆراک ببەخشیت و ، سلاّو بکەیت لەوەی دەیناسیت و لەوەش کە نایناسیت .

14- مَن كَانَ فِي حَاجَةِ أَخيهِ كَانَ اللهُ في حَاجَتِهِ ، وَمَن فَرَّجَ عَن مُسلِمٍ كُربَةً فَرَّجَ اللهُ عنه بها كُربَةً مِن كُرَبِ يَومِ القِيامَة .(رواه أبوداود)

هەرکەس خەریکی کاروباری برایەکی بێت ، خوا کارو باری بۆ جێ بەجێ دەکات ، هەرکەس نارەحەتیەک لەسەر موسڵمانێک لابەرێت ، خوا بەو هۆیەوە نارەحەتیەکی ڕۆژی دوایی بۆ لا دەبات .

15- أَلا أُنَبِّئُكُم بأكبَرَ الكَبائر؟ قُلنا بَلى يا رسُولَ الله ، قالَ : الإشراكُ بِالله ، وَعُقُوقُ الوَالِدَين . وَكانَ مُتّكئاً فَجَلَسَ فَقالَ : أَلا وَقَولُ شَهادةِ الزّور .... ( متفق عليه )

ئایا لەگەورەترینی گوناهە گەورەکان ئاگادارتان کەمەوە ؟ ووتمان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا . فەرمووی : هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا. سەرپێچی کردنی دایک و باوک . لەو کاتەدا شانی دادابوو پاشان دانیشت و فەرمووی : ئاگاداربن گەواهیدان و شایەتی درۆش ...

16- عَن ابنِ عُمَرَ قَال : أخَذَ رَسُولُ الله بِمَنكِبِي فَقالَ : كُن فِي الدُّنيا كأنَّكَ غريبٌ أَو عابِرُ سَبيلٍ . ( رواه البخاري )

لە دنیادا وەکو غەریبێک یا ڕێبوارێک بژی .

17– عَجَبا لأمرِ المُؤمنِ لا يَقضي اللهُ لَهُ قَضاءً إلا كانَ خَيراً لَهُ ، إنَّ أَصابَتهُ ضَرَّاءَ صَبَرَ فَكانَ خَيراً لَهُ وَإن أَصابَتهُ سَرَّاءَ شَكرَ فَكانَ خيراً لَهُ . ( متفق عليه )

**حالّی بڕوادار زۆر جێ ی سەرسوڕمانە : خوا هەرچی بۆ بڕیار دەدا بە خێری تەواو دەبێت . ئەگەر ئازار و نارەحەتی پێ گەیشت خۆی ڕادەگرێ و سەبر دەکا و سەرەنجام دەبێ بە خێر بۆی. ئەگەر خۆشی و شادیەکیشی پێ گەیشت سوپاسی خوا دەکاو سەرئەنجام ئەوەش دەبێ بەخێر بۆی .**

18– لا تَحقِرَنَّ مِنَ المَعروفِ شَيئاً وَلَو أن تَلقى أَخاكَ بِوجَهٍ طَليق .( رواه مسلم )

**لە کاری چاک و پەسەند هیچ شتێک بێ نرخ سەیر مەکە ، ئەگەر ئەوەش بێت کە بە روویەکی خۆش و کراوەوە روو بەرووی براکەت ببی .**

19– أُنظُروا إلى مَن هُوَ أسفَلَ مِنكُم ، وَلا تنظُروا إلى مَن هُوَ فَوقَكُم فَهُوَ أجدرُ أن لا تَزدَروا نِعمَةَ اللهِ عَلَيْكُم . ( رواه مسلم )

**سەیری لەخۆتان بەرەو خوارتر بکەن و مەڕوانن بۆ بەرەو ژوور تر لە خۆتان ، ئەمە شیاوترە بۆ ئەوەی کە بە بێ ڕێزی سەیری ئەو نیعمەتانە نەکەن کە خودا پێی بەخشیون .**

20– مَن رَدَّ عَن عِرضِ أَخيه رَدّ اللهُ عَن وَجْهِهِ النارَ يَومَ القِيامةِ .

( رواه الترمذي و قال حديث حسن )

**هەرکەس لە ناموسی برایەکی پشتگیری بکات ، خوا لە پاشەڕۆژدا ئاگر لە رووی دوور دەخاتەوە .**

21– البِرُّ حُسنُ الخُلُقِ ، وَالإثمُ ما حاكَ في صَدرِكَ وَكَرِهتَ أنْ يطَّلِعَ عَلَيهِ النَّاس . ( رواه مسلم )

چاکەی زۆر ڕەوشت جوانی یە ، گوناهیش ئەوەیە کە لە دڵتا خورتە خورت بکا و پێت ناخۆش بێت خەڵکی پێی بزانێت .

22- ما أَذِنَ اللهُ لِشَيءٍ ما أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوتِ يَتَغَنَّي بِالقرآنِ يَجهَرُ بِهِ . ( متفق عليه )

خوا مۆڵەتی نەداوە بۆ هیچ شتێک هەروەکو مۆڵەتی داوە بە پێغەمبەرێکی دەنگ خۆش کە بە ئاوازەوە بە دەنگی ئاشکرا قورئان بخوێنێنەوە

23- لا يَخلُوَنَّ أَحَدَكُم بِامرَأَةٍ إِلا مَعَ ذي رَحِمٍ مَحرَم . ( متفق عليه )

هیچ کەس لە ئێوە لەگەڵ ئافرەتێکدا گۆشەگیر نەبێ و لە شوێنی چۆڵدا لەگەڵی کۆنەبێتەوە مەگەر لەگەڵ کەسێکی مەحرەم دا.

24- نِعمَتانِ مَغبونٌ فيهِما كَثيرٌ مِنَ النَّاس : الصَّحَةُ والفَرَاغُ .( رواه البخاري )

دوو نیعمەت زۆر کەس تیایدا خەسارەتمەند و دۆڕاون : تەندروستی و ، بێکاری و فەراغەت . ( واتە ناتوانن بە شێوەی شیاوو تەواو سوود لەو دوو نیعمەتە وەربگرن )

25- أَلمؤمنُ القَويُّ خَيرٌ وَأَحبُ إلى اللهِ مِنَ الْمُؤمنِ الضَّعيف ، وَفِي كُلٍ خَيرٌ ، أَحرِص عَلى مايَنفَعُكَ ، وأستَعِن بِاللهِ ، وَلاَ تَعجَز ، وَإِن أَصابَكَ شَيءٌ فَلا تَقُل : لَو أنّي فَعَلْتُ كانَ كذا وَكذا ، وَلكِن قُل : قَدَّرَ اللهُ وَمَا شآءَ فَعَل ، فإنَّ ( لَو ) تَفتَحُ عَمَلَ الشَّيطانِ ... ( رواه مسلم )

بڕواداری بەهێز و بازوو باشتر و خۆشەویست ترە لای خوا لە بڕواداری لاواز ، بەڵام لە هەردوو لایاندا خێر و چاکە هەیە . سووربە لەسەر ئەو شتەی کە سوودت پێ ئەگەیەنێ و بە خوا پشت ببەستە و لاوازی مەنوێنە ئەگەر شتێکت تووش هات مەڵێ: ئەگەر واو وام بکردایە واو وا دەبوو ، بەڵکو بڵێ : خوا وای بڕیارداوەو هەرچیش خۆی مەیلی بێ دەیکا ، چونکە وشەی (ئەگەر) (دەرگای) کاری شەیتان دەکاتەوە .

26- مَا يُصيبُ الْمُسلِمَ مِنَ نَصَبٍ وَلا وَصَبٍ وَلا هَمٍ وَلا حَزَنٍ وَلا أَذى وَلا غَم حتى الشَّوكَةَ يُشاكُها ، إِلا كَفَّرَ اللهُ بِها مِن خَطاياهُ .( رواه مسلم )

هەرچیەک کە تووشی موسڵمان دێت لە : ماندوویی و نارەحەتی و مەراق و خەفەت و ئازار و خەم ، تەنانەت دڕکیش کە بە پێ ی دا دەپێت خوا بەو شتانە لە گوناهی هەڵدەوەرێنێت.

27– لا تَزولُ قدَما عَبد حتى يُسأَلَ عَن عُمُرِه فيمَ أفناهُ ، وَعَن عِلمه فيمَ فَعَلَ فيه ، وَ عَن مالِه مِن أينَ اكتَسَبهُ وَفيمَ أنفَقَهُ ، وَعَن جِسمِه فيمَ أَبلاهُ . ( رواه الترمذي و قال حديث حسن صحيح)

دوو پێ ی هیچ بەندەیەک ناترازێت تا (لە چوارشت) پرسیاری لێ نەکرێت : لە تەمەنی : کە لە چیدا بەسەری بردووە ، لە عیلم و زانستی : کە لە چیدا بەکاری هێناوە ، لە سامانی : کە لە کوێوە پەیدای کردووە و لە چیدا بەخشیویەتی ، وەلە لاشەی کە لە چیدا تاقی کردووەتەوە ؟

28– عَلى كلُّ مُسلِمٍ صَدَقَةٌ ، قَالَ أَرَأيتَ إِن لَم يَجِد؟

قَالَ : يَعمَلُ بِيَدَيه فَيَنفَعُ نَفسَهُ وَيَتَصَدَّق ، قَالَ : اَرَأيتَ إِن لَم يَستَطِع؟ قَالَ : يُعِينُ ذا الحاجةِ المَلهُوف . قالَ : أَرأَيتَ إِن لَم يَستَطِع؟ قَالَ : يأمُرُ بِالمعروفِ أوالخَيرِ . قَالَ : أرَأيتَ إن لَم يَفعَل ؟ قَالَ : يُمسِكُ عَنِ الشَرَّ فَإنَّها صَدَقَةٌ . ( متفق عليه )

هەموو موسڵمانێک خێر کردنی لەسەرە ، یەکێ پرسی : ئەی ئەگەر نەیبوو ؟ فەرمووی : بە دەستی خۆی ئیش بکات و سوود بە خۆی و غەیری خۆی بگەیەنێ ، ووتی : ئەی ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی : یارمەتی خەڵکی لێقەوماوی موحتاج بدات ، ووتی : ئەی ئەگەر نەیکرد؟ فەرمووی : خۆی بگرێ لە خراپە کردن ، ئەوە خۆی چاکە کردن و ( صدقە ) یە .

29– يَا أَيُّها النَّاسُ ! مَن عَلِمَ شَيئاً فَليَقُم بِه ، وَمَن لَم يَعلَم فَليَقُل اللهُ أَعلَم ، فإنَ مِنَ العِلمِ أَن يَقُولَ الرَّجُلُ لِما لا يَعلَمُ : اللهُ أعلمُ قالَ اللهُ تَعالى لِنَبيِه : قُل ما أَسأَلُكُم عَلَيهِ مَن أجرٍ وَما أَنَا مِنَ المُتَكَلِّفينَ .( رواه البخاري )

ئەی خەڵکینە ! هەرکەس شتێکی زانی با بە گوێرەی زانینەکەی جێ بە جێ ی بکات و ، هەرکەس نەیزانی با بڵێت : خوا باشتر دەزانێت ، چونکە ئەمە عیلمە کە یەکێک سەبارەت بەشتێک کە نایزانێت بڵێت : خوا باشتر دەزانێت . خوا بە پێغەمبەرەکەی

فەرمووە : ئەی محمد! تۆ بڵێ لەسەر گەیاندنی (ئەم پەیامە) داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم و ، من لەو کەسانە نیم کە زۆر لە خۆیان دەکەن

30- إنَّ المؤمِنَ لَيُدرِكُ بِحُسنِ الخُلُقِ دَرَجَةِ الصَّائِمِ القائِم.( رواه ابو داو )

بڕوادار بە ڕەوشت جوانی دەگاتە پلەی ڕۆژووگری شەوبێدار .

31- جَاءَ رَجُلٌ إلَى رَسُولِ اللهِ فَقالَ : أوصِنِي فَقالَ : لا تغضَب .( رواه البخاري )

پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خواو عەرزی کرد : ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی : تووڕە مەبە ( لە ریوایەتێکدا سێ جار فەرمووی : تووڕە مەبە ) .

32- أيُّهَا النَّاس ! إنَّ اللهَ طَيِّبٌ لا يَقبَلُ إلاّ طَيبا – وَإنَّ الله أَمَرَ المؤمنينَ بما أمَرَ به المرسَلينَ ، فَقالَ ( يا أيُّها الرُّسُلُ كُلوا مِنَ الطَّيِّباتِ وَاعمَلوا صالحا ) وَقالَ تَعالى : ( ياأيها الذينَ آمنو كُلُوا من طَيباتِ ما رَزَقناكُم ) ثُمَّ ذَكرَ الرَّجُلَ يُطيلُ السَّفَرَ ، أشعَثَ أغبَرَ ، يَمُدُّ يَدَيهِ إلى السَّمآءِ : يا ربُّ يا ربُّ !! وَمَطعَمُهُ حَرامٌ وَمَشرَبُهُ حَرامٌ ، وَغُذِيَ بِالحرامِ فأنَّى يُستَجابُ لَهُ ؟!.. ( رواه مسلم )

ئەی خەڵکینە ! بەڕاستی خوا خاوێنە و هەرچی خاوێن نەبێت وەری ناگرێت . بەڕاستی خوا ئەو فەرمانەی کە بەسەر پێغەمبەرانیدا داوە بەسەر موسڵمانانیشدا داوە .
فەرموویەتی : ئەی پێغەمبەران ؛ لەو شتە پاک و خاوێنەکان بخۆن و کاری چاکە بکەن ، هەروەها فەرموویەتی : ئەی بڕواداران ؛ لەو شتە پاک و خاوێنانەی کە پێمان داون بخۆن.. پاشان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیة وسلم) باسی کەسێکی کرد کە لە سەفەردا زۆری پێ دەچێ و، سەرو پرچی هاتووە و تەپ و تۆزاویەو ، دوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرز دەکاتەوە و، (دەڵێ) : ئەی پەروەردگارم ؛ ئەی پەروەردگارم ؛ لە کاتێکدا کە خواردن و خواردنەوەی حەرامە و بە حەرام تێرکراوە ، ئیتر چۆن پاڕانەوەی گیرا دەبێ و چۆن وەڵامی دەدرێتەوە ؟!.

33- ما مِن يَومٍ يُصبِحُ العِبادُ فِيهِ إلا مَلَكَان يَنـــزلانِ ، فَيَقُلُ أحَدُهُما : (اللهمُ أعطِ مُنفِقاً خَلَفاً ، وَيَقولَ الآخرُ: اللَّهمَّ أعطِ مُمسِكاً تَلَفاً ) .

هیچ شەوێ ڕۆژ لە بەندەکانی خوا نابێتەوە مەگەر دوو فریشتە دێنە خوارەوە و یەکێکیان دەڵێت : خوایە ؛ هەرکەس سامانی دەبەخشێت و ( صدقە ) دەکات ماڵی تری پێ

بده ، ئەوەی تریشیان دەڵێت : خوایە ؛ هەرکەس دەستی قوچاندووە و لە دارایی خۆی نابەخشێماڵەکەی لە نێو بەرەو بیفەوتێنە .

34- أَيُّكم مَالُ وارِثِه أَحَبُّ إلَيهِ مِن مالِهِ . قالُوا : يا رَسُلَ الله ! ما مِنا إلا مَالُهُ أَحَبُّ إلَيهِ . قال : فإنَّ مالَهُ ما قَدَّم و مَالُ وَارِثِهِ ما أخَّرَ.( رواه البخاري )

کێ لە ئێوە ماڵی خۆی لە لا خۆشەویست رە ؟ ووتیان : ئەی پێغەمبەری خوا ؛ هەموومان ماڵی خۆمان لە لا خۆشەویست ترە . فەرمووی : دەی بەڕاستی هەرکەس ماڵی خۆی ئەوەیە کە پێشی خۆی خستووە و بەخشیویەتی و ، ماڵی میرات بەرەکەی ئەوەیە کە هێشتویەتەوە . ( چونکە بۆ ئەو بەجێ دەمێنێت ) .

35- لا يَبْلُغُ العَبْدُ أَنْ يَكونَ مِنَ المُتقِّينَ حَتّى يَدَعَ ما لا بَأْسَ بِهِ حَذَراً مِمَّا بِهِ بَأسْ . ( رواه الترمذي و قال حديث حسن )

بەندەی خوا ناگاتە ڕادەیەک کە بچێتە ڕیزی لە خوا ترسان و (متقي) یەکان ، تا واز لەو شتانە بێنێت کە لە ڕووی شەرعی یەوە گیروگرفتیان لەسەر نی یە ، لە ترسی ئەوەی کە نەبێ بە تووشی ئەو شتانەوە کە لە ڕووی شەرعی یەوە پەسەند نین .

36- إيّاكُم وَالدُّخُلُ عَلى النَّساءِ ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأنصارِ : أَفَرَأَيتَ الحَمْوَ ؟ قَالَ : الحَموُ المَوتُ . ( متفق عليه )

وریابن خۆتان لە چوونە لای ئافرەتان ( بە تەنیایی ) بپارێزن ، پیاوێک لە یاریدەدەران فەرمووی : ئەی خزمی نزیکی ژن بۆ بۆ پیاوەکەی یا بە پێچەوانەوە ( واتە ماڵە خەزورانی هەردوولا بۆ یەکتر وەکو -ژن خوشک- بۆ پیاو ، یا -هێوەر- بۆ ژن ، حوکمی چۆنە ؟ فەرمووی : ئەوە هەر مەرگە . (واتە مەرگ لەو کارە چاکترە ، یا ئەو کارە مرێنەرە ) دیارە ئەوە دەگەیەنێت کە حوکمەکەی توندترە ، چونکە جێگەی گومان نی یە و خەڵکی تووش بوونی گوناه بە دوور دەزانن و بەو هۆیەوە شەیتان زیاتر لە کەمیندایە .

37– إذا آوَى أحَدُكُم إلى فِراشه فَلْيَنفضْهُ بداخلَة إزارِه فإنَّهُ لا يَدري ما خَلْفَهَ عَلَيه ، ثُمَّ لِيَقُلْ : باسمِكَ رَبّي وَضَعتُ جَنبي وَبِكَ أرفَعُهُ . إن أَمسَكتَ نَفسي فَارحمها وَإن أَرسَلتَها فَاحفَظها بِما تَحفَظُ بِه عِبادَكَ الصَّالِحينَ . ( متفق عليه )

گەر کەسێکتان چووە ناو جێگای نووستن باجێوبانەکەی بتەکێنێت ، چونکە نازانێ چی تیا بەجێ ماوە ( واتە دەگونجێت جانەوەرێک یا شتێکی ئازاردەری تێدا بێت ) ، پاشان بڵێت : بەناوی تۆوە ئەی پەروەردگارم ڕاکشام و بەناوی تۆشەوە هەڵدەستمەوە . ئەگەر لەم نوستنەم دا گیانت کێشام ڕەحمم پێ بکەو ، ئەگەر گیانیشت نەکێشام بەو شێوەیەی گیانی پیاوچاکانی خۆتی پێ دەپارێزی ، بیپارێزە .

38– أللّهُمَّ إنِيّ أَسأَلُكَ الهُدى والتّقى والعَفَافَ وَالغِنى . ( رواه مسلم )

ئەی خوایە؛ بە ڕاستی من ڕێنومایی و لە خوا ترسان و داوێنپاکی و قەناعەت و بێ ئیحتیاجی ، هەر لە تۆ داوا ئەکەم .

39– مَن خافَ أدلَجَ ، وَمَن أدلَجَ بَلَغَ المَنــزِلَ ، ألا إنَّ سِلعَةَ الله غالِيَة ألا إنَّ سِلعَةَ الله الجَنَّة . ( رواه الترمذي و قال حديث حسن )

هەرکەسێ بترسێ ( زوو و لە سەرەتای شەوی تەمەنیدا ) دەکەوێتە ڕێ ، وە هەرکەس زوو بکەوێتە ڕێ دەگاتە مەنزڵ ، ئاگادار بن؛ بە ڕاستی کاڵای خوا گرانە ، ئاگادار بن؛ کاڵای خوا بەهەشتە .

40– بَادِرُوا بالأعمَالِ سَبعاً ، هَل تَنظُرونَ إلاّ : فَقراً مَنسيا ، أو غَنِيَ مَطغِياً ، أو مَرَضاً مُفسداً ، أو هَرماً مُفنِداً ، أو مَوتاً مُجهِزاً ، أوِ الدَّجال ، فَشَرُّ غائِب يُنتَظَر ، أو السّاعة والساعَةُ أدهَى وَأمَرّ .( رواه الترمذي و قال حديث حسن )

لە حەوت کاردا دەست پێش خەری بکەن ، ئێوە جگە لەم حەوت شتە چاوەڕوانی چی تر دەکەن ؟ : یا هەژاری یەک کە شتتان لە بیر دەباتەوە ، یا دەوڵەمەندییەک کە سەرکەشتان دەکات ، یا نەخۆشی یەک کە ئەتان فەوتێنێت ، یا پیری یەک کە ئەتان خلاڧێنێت ، یا مردنێک کە ئەتان بڕێتەوە ، یا دەججال ، کە خراپترین گوم بوویەکی چاوەڕوان کراوە ، یا دوا ڕۆژ کە زۆر تاڵ و ناسۆر ترە .